PDF 4 KURD

## ناوەندی چاپەمەنی و ڕاگەیاندنی خاك



ناوی کتێب: ڕازی تەنیایی
بابەت: شیعر
نوسینی: ئەحمەد هەردی
کاری کۆمپیوتەریی: هێدی محەمەد
دیزاینی بەرگ: مەحمود خۆشناو
چاپی یەکەم ١٩٥٧
چاپی دووەم ١٩٨٤
تیراژ: (١٥٠٠) دانە

## بێ ئارامیی[1]

ئاخ و داخ و دەرد، لەدەست تەنیایی
پەشێویی بێ حەد، دەردی بێ دوایی
ئەم سەرسامییە
بێ ئارامییە
دڵ ناکامییە
کەی دێ کۆتایی؟

* * *

بۆ هەرکوێ ئەچم پێی خراپترم
ئاسرەوێ دڵەی پڕ لەئاگرم
نە لەناو گوڵزار
نە لای خزم و یار
نە لەدەشت وشار
ئۆقرە ناگرم

* * *

لەدەست شار هەڵدێم، ئەچمە ناو گوڵزار
لەوێش هەڵناکەم، دێمەوە ناوشار

---

[1] ئەم شیعرە لەچاپی یەکەمدا نییە، یەکێکە لەو شیعرانەی لەسەرەتای هەرزەکاریمدا داماناوە، رەنگە هاوڕێیەکی رەفت مامۆستا (عومەر عارف) نەبێ، کەسێکی تر لێی نەبیستبێم، شیعرەکە خۆی شتێکی ئەوتۆ نییە، بەڵام لەچاو کاتی خۆیدا (کە نزیکەی نیو سەدەیەک لەمەوبەرە) شتێکی تازەیە، چ لەڕووی بابەت و چ لەڕووی ریزکردن و هەڵبژاردنی وشەی نوێوە، بۆیە بەپێویستم زانی بڵاوبیکەمەوە.



PDF 4 KURD

وەك ئارام نەماو
دڵ و پێ سووتاو
خانەی خەو رووخاو
لەدنیا بێزار

* * *

کە بەتێکەڵبوون، وەها بێزارم
بۆچ بەتەنیایی پەشێوە کارم؟
بۆ وەك رەنجەڕۆم
وەڕس بووم لەخۆم
بۆهەر کوێ ئەڕۆم
دڵ بێ قەرارم؟

سلێمانی/ ١٩٣٨



PDF 4 KURD

## فەلسەفەی دڵداری(١)

شیعری (شیللی)یە، لەعەرەبییەوە کراوە بەکوردی

که جۆگا[٢] تێکەڵی چەم بێ و چەمیش تێکەڵ بەدەریابێ
شەماڵیش پڕ لەهەستیی بێ، نییە شت تاك و تەنیا بێ
بەقانونی خودا[٣] ئەشیا، ئەبێ تێکەڵ بەیەکتربێ
ئیتر، بۆچی من و تۆ تێکەڵی یەکتر ببین نابێ..؟!
که کێو و کەژ بکەن ماچی هەموو ئاسمانی بەرزوشین،
شەپۆلیش هەروەکو دڵدار، لەمل یەك دەستی ئاڵابێ
ئەبەد نابێ کە خوشکی گوڵ، برای دەرکات و لێی دووربێ
که تیشکی رۆژ، زەمینی هەروەکو دولبەر، لەکۆشابێ

[١] لەبیرم دێت کاتی خۆی، ئەم شیعرەم لە گۆڤاری (المجلة)ی (عبدالحق فاضل)ەوە وەرگرتوە کە ئێستاش دەقە عەرەبییەکەیم لەبیرە، ئەوەشم لەبیرە کەلەگۆڤاری (گەلاوێژ)دا بڵاوکراوەتەوە، بەڵام نوسەری بەڕێز مامۆستا (عومەر)ی بەرزنجەیی بیری خستمەوە، کە لە ١٤ی ئەیلولی ١٩٣٩دا ئەم شیعرە لە حەرتەنامەی (ژین)دا بڵاوکراوەتەوە، واتە چەند مانگێك پێش ئەوەی گۆڤاری (گەلاوێژ) لەشوباتی ١٩٤٠دا ئەم شیعرە بەپەخشان بکات بەکوردی و لەژمارە ٣ی ساڵی ١دا بڵاوی بکاتەوە. کەچی لەساڵی ١٩٤٣دا کە ئەم شیعرەی من لە(گەلاوێژ)دا نوسرا، تێبینیەکی وای لێنوسرابوو کەوابگەیەنێت، گوایە (شیعرەکەی من لە پەخشانەکەی (گەلاوێژ)ەوە وەرگیراوە!!) لەکاتێکدا کە شیعرەکە چەند مانگێك پێش پەخشانەکە (گەلاوێژ) لە (ژین)دا بڵاوکراوەتەوە وەك مامۆستا عومەر بیری خستمەوە. بەم بۆنەیەوە زۆر سوپاسی مامۆستای ناوبراو ئەکەم، هیوادارم وێنەیان زۆربێت، هەروەك سوپاسی مامۆستا (مستەفا سالح کەریم) ئەکەم کە ناوی (عبدالحق فاضل)ی بیر خستمەوە.

[٢] لە (گەلاوێژ)دا (کە جۆگە) نوسراوە.

[٣] لە رووی کێشەوە ئەبێ بڵێیت (خودا) بەدوو واو، لەبەرئەوە (خودا)م بەراستتر زانی.

ئەوا مانگیش ئەکا ماچی بەحر، گەر تۆش نەکەی ماچم[٤]
هەمووی بۆ کەڵکە ئەم ماچانە، بۆ تۆ فائیدەی نابێ[٥].

بەغدا/ ١٩٣٩

---

[٤] لە (گەلاوێژ)دا (گەرتۆش نەکەی ماچێ) نوسراوەو بەپێی ئەوەی کە مامۆستا (عومەر بەرزنجی) بۆی نوسیووم وادیارە لە (ژین)یشدا هەر (ماچێ) نوسرابێ، راستیەکەی ئەوەیە کە نوسیم

[٥] ئەم شیعرە لە چاپی یەکەمدا نییە.

PDF 4 KURD

## ئەی دیدە پەری(١)

ئەی دیدەپەری بەودەمە، بەو کوڵمە گوڵینە
بۆ کەس نییە تاسەر، ئەوەڕێ، ئەم گوڵی ژینە
تاسەر نییە ئەم نازە، وەها دووری مەبینە
ئەوچاوە گەلاوێژە خەڵاتی کە برینە
ئەو زوڵفە کە ئێستاکە دووتوێی عەنبەری چینە
رۆژێکی کە دێ، تێکەڵی توێی خاکی زەمینە

* * *

ئەو گەردنە بێگەردە کە وەك تەختی بلوورە
ئەو لێوە کە وەك خونچە تەڕو ناسك و سوورە
ئێستاکە بەبێ رەحمی سزای جەورو فتورە
لای وایە، کە ژین فانی نییەو رێگەیی دوورە
نایزانێ کە هەر پەنجەیێ لەم خاکی زەمینە
کوڵمی دەهەزار (لەیل) و دەمی سەد (مەم وزین)ە

---

(١) ئەم شیعرە کاتی خۆی، لەرۆژنامە، یان با بڵێین: هەفتەنامەی (ژین)دا بەناوی (دوابیت لەبیرین) بڵاوکراوەتەوەو لەهەندێ شوێندا، دەستکاری شعرەکە کراوە (بڕوانە ژین_ ژمارە ٥٧٧ی ٢٤ی ئەگستۆسی ١٩٣٩ ل٤) کە لەدەرفەتێکی تردا باسی ئەکەم. لەساڵی ١٩٥٧دا: من کە شیعرەکەی خۆمم لەبەربوو ئەوەبوو لە (رازی تەنیایی) دا بڵاوم کردەوە بێ ئەوەی گوێ بدەمە دەستکاری کردنەکەی (ژین).

شایانی باسی ئێستاش دەقی شیعرەکەی خۆم و هەندێک شوێنی ئەو دەستکارییەی ژینم بە تێکڕایی لەبیر ماوە، بەڵام بۆئەوەی بەوردی شوێن ئەندازەی دەستکارییەکان بزانم، حەزمکرد دەقی بڵاوکردنەوەکەی (ژین)م لەبەردەستدا بێ. لەم روەوە زۆر سوپاسی هاوڕێی بەڕێز کاک (عەبدوللا عەزیز) ئەکەم، کە نەک هەر ژمارەو ساڵی رۆژنامەی ژینی بۆ دۆزییەوە، بەڵکو دەقی بڵاوکردنەوەکەی ژینیشی بۆ هێنام.

ئەمڕۆ دڵی بێچارە ئەبەی ئەیخەیتە ناوداو
نایزانی سبەینێ ئەکەوی سەرگژو داماو
ئەو جوانییە ئەڕوات و لەچاو گوم ئەبێ وەك ئاو
ئەو ڕۆژە ئەبێ دائیمە هەر بێنیە بەرچاو
تا ڕەحمێ بکەی ئێستاکە بەم زام و برینە
سەرگژ ئەبی لەو جێگە بێ سامانی زەمینە

* * *

ئەم چەند قسەیەم وتوە بەتۆ، ئێستە[٣] بەچاکی
گەرچی ئەشیزانم[٤] دڵی بەردت نییە باکی
مەڕوانەرە ئەمڕۆ، کە بەڕوومەت گوڵی تاکی
بڕوانە سبەینێ، کە لەناو دامەنی خاکی
سەد لەیلی وەکو تۆ بووە لەم ڕۆشنی ژینە
ئێستاکە لەناو، جەرگەیی تاریکی زەمینە

سلێمانی/ ١٩٣٩

[٣] لەچاپی یەکەمدا لەباتی (ئێستا)، (ئەمڕۆ) نوسراوە
[٤] لەچاپی یەکەمدا (گەرچی ئەشزانی) نوسراوە

PDF 4 KURD

## ئانگۆی کوردی[1]

ئاقانە خونچەکەی باخی ژیانم
زیندووکەرەوەی ئاواتی بێ گیانم
ڕۆشنکەری، ڕێگای ژین و مانم
با لەدەستی، ژینی پەستی، شارودێ، شارودێ
ڕاکەین و ڕووبکەینە چۆڵ و هەردی، ئاوهەردێ
تەنیا، وەك ئاسکۆڵەی کۆسار
ڕووبکەینە قەدشاخ و ئاوگوڵزار[2]

* * *

لەقادپاڵی شاخی هەزار بەهەزار
لەسای سێبەری درەختی ئاوگوڵزار
کونجێ بکەین بەهێلانەو هەوار
دەست لەگەردن، تاکو مردن، شۆخ وشاد، شۆخ و شاد

---

[1] ئەم شیعرەم لەسەر ئاوازێکی ڕۆژئاوایی داناوە لەچاوپێکەوتنێکی ئەدەبیدا ساڵی ١٩٨١ وتبووم ڕەنگە ئەم شیعرەم ساڵی ١٩٣٨ وتبێت، بەڵام لەدواییدا چەند بەڵگەو سۆراغێك بیریان خستمەوە کەلەساڵی (١٩٤١)دا بووە، پێش ئەوەی ببم بە مامۆستای قوتابخانە بەیەك دوو مانگێك. بەهەرحاڵ، من ئێستا لەدورووشت دڵنیام، یەکەمیان ئەوەیە داناني شیعرەکە ساڵی ١٩٤١ بووە. دووەمیان ئەوەیە، دڵنیام لەوەی کاتێك ئەم شیعرەم وتووە، هیچ جۆرە ئاشنایەتیم لەگەڵ هیچ حیزب و سیاسەتێکدا نەبووە، بەڵام هاورێی بەرێزم (د.عیزەدین مستەفا) وائەزانێت ئەم شیعرە دوای ساڵی ١٩٤٩ دانراوە، دەیەرێنەوە ئەیکات بە بەڵگەیەك بۆ بیروباوەڕی ساڵانی دوای ١٩٤٩ی من، بڕوانە دکتۆرنامەکەی مامۆستای ناوبراو (الواقعیە فی الادب دار المکتبە العصریە بلا تاریخ بیروت ص١٠٩)
لەکاتێکدا کە وەکو لەپێشەوە نوسیم، ساڵی ١٩٤١ وتراوە.
[2] ئەم دێڕە لەچاپی یەکەمدا، لەبیرچووبوو.

خەمی دنیا، بەماچ بدەین بەباد، هەر بەباد
گۆنات، هەڵمژم پڕ بەدەم
سوورهەڵگەڕێ هێندە ماچی کەم

سلێمانی/ ١٩٤١



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

## شۆڕشی نائومێدی

"لەکاتێکدا کە ئادەمیزاد، بەرێکەوت بۆی دەرئەکەوێت: کە ئەو ترێقەی پێکەنینانەی، بەماکی خۆشەویستی ئەزانی، هەوێنی ئەفرەدان و دەست بڕینە، لەکاتی وادا، ئادەمیزاد، رقی لەدڵداری و خۆشەویستی بەجۆرێك هەڵئەسێ کە حەز ناکات تەنانەت چارەی ئەو یادگارانەش ببینێت کە لەو دڵداریە بەجێ ماون.. لەکاتێکی وادا ئەم هەڵبەستەی خوارەوە دانراوە".

بناغەو چینی دیواری
تەلاری بەرزی دڵداریی
بەسەر لانەی دڵا رووخا ، تەپوتۆزی خەمی هێنا
بەدووی باڵداری ئاواتی، فڕیوی بێ سەرو شوێنا
دەسا ئەی پاییزی ماتەم ، ئەوەندەم تاسە پێ ماوە
هەموو ئەو یادگارەی لەو ژیانی عەشقە جێ ماوە
بەجارێ وەك گەڵا سروەی خەزانت گشتی رامالێ
بەوردیی هەر گەڵایێکی، ببا بۆ قوژبن و چاڵێ
* * *
دەبا (با) ڕەش لە دواییدا
لەبیابانی... لماویدا
تەپوتۆزێکی وا بێنێ، هەوا یەکجاریی بخرۆشێ
سەری ئەو قوژبن و چاڵە، وەکو گۆڕیچکە داپۆشێ
لەپاشانا بەبای وەشتا، لەسەردا هەوری رەش بێنێ
بەگۆڕی یادگارا، با، بەخوڕ تاوێ ببارێنێ
دەبا بمرێ بەیەکجاریی لەگۆڕی تەنگ و تەنیادا
نیشانەو ناوی هەڵگیرێ لەناو بازاڕی دنیادا

PDF 4 KURD

بەڵێ با گەردەلوولێ بێ
ئەوی بۆنێکی تۆی لێبێ
وەکو ئەو پووشە راپێچی بکا بۆ گۆڕی تەنیایی
بەگوێیا با بچرپێنێ نقامی عومری کۆتایی
پەپوو[1] هاوڕازی[2] وێرانەو نیشانەی مەرگی رووناکیی
بەدەنگی شومی با شیوەن بکا بۆ گیانی ناپاکی
لەسەر ئەو دەنگ و ئاوازە، دەبا شەیتانی راڕایی
سەمای پڕ تەوسی بێ شەرمی بکا بۆ عەشقی کۆتایی

* * *

دەبا دەستی ستەمکاریی
ژیانی پڕ لەزۆرداریی
لەیادا بیسڕێ شێوەت لەیادی ژین و گەردوونا
بەبێ رەحمانە غەرقی کا، لەبەحری قوڵی ونبوونا
ونی کا با لەبەرچاوم، نیگاری چاوی فێڵاویت
گوڵی بێ بۆنی جوانیت و بزەی سەرلێوی ژەهراویت
بەتاپۆی[3] یادگاری تێکشکاوی بێ سەروپێوە
بەدڵداری عومری کورت و شەواتی جوانەمەرگێوە

سلێمانی/ ١٩٤٤

---

[1] پەپوو: لێرەدا مەبەست (کوندەپەپوو)ە کەلای ئێمە (کوندەپەپوو)شی پێ ئەڵێن.
[2] لەچاپی یەکەمدا (هامراز) نووسراوە (رازی تەنیایی ل١٩).
[3] تاپۆ لەشارەزوور بەقارەماییەک ئەڵێن کە بەعاستەم دیاربێت، لێرەدا لەجێی (شبح)ی عەرەبی بەکارهێنراوە.

PDF 4 KURD

# دڵێکی تێکشکاو[1]

ئەم شیعرە، هەرچەندە لەچاپی یەکەمدا حەوت بەیتە، لەگەڵ ئەوەشدا رۆشنبیران، گەلێک بابەخیان پێداوەو لێی دواون . هی وابووە ئەم شیعرەی، بەیادکردنەوەی قوناخێکی سیاسی زانیوە! لەبەرئەوە پێی وابووە دوای ساڵی ۱۹٤۹ دانراوە! وەک هاوڕێی بەرێز (د.عیزەدین مستەفا[2])، هی واش بووە گرموەی لەسەرئەوە کردووە، کە گوایە من ناتوانم ئەم شیعرە تەواوبکەم! وەک هاوڕێی بەرێز مامۆستا (عومەر عارف)، هی واش بووە، وەک مامۆستا (کاکەی فەللاح) کە لای وابووە، نەک هەرتەنیا لەم شیعرەدا نەمتوانیوە (بکەمە کۆتاییەکی سەرکەوتووانە)، بەڵکو جارێکی تر ناتوانم شیعرێکی تری لەو بابەتە بڵێم !!. بەهەرحاڵ، لەوانەشە، ئەوانەی ئاشنای شیعری کۆنن، ئەم تەواوکردنە بەهونەرێک نەزانن! چونکە لەشیعری کۆندا لابردن و زیادکردنی چەند بەیتێک، شتێکی ئەوەندە گران نییە.

هەرچۆنێ بێت، ئێستا کە شیعرەکەم تەواوکرووە پێشکەشی رۆشنبیرانی کوردی دەکەم، هیوام وایە، ئامی هەمان حەوت بەیتەکەی پێشووی لێ ببینن.

ئەحمەد هەردی

بەسەرسامی لەسەر لوتکەی بڵندی گەنجیی وەستاوم
شریتی عومری رابردووم وەکو خەو دێتە بەرچاوم
شریتی چی؟ سەراپا سەرگورشتەی[3] نائومێدیمە

---

1. ئەم شیعرە لەچاپی یەکەمدا ناوی(نائومێدی)یە، چونکە لەوێدا بەسەرهاتی دڵ، کەمەبەستی سەرەکی شیعرەکەیە، تەواونەکراوە. بڕوانە (رازی تەنیایی، چاپی یەکەم ل ۲۳)
2. هاوڕێی بەرێز (د. عیزەدین مستەفا) وا ئەزانێت ئەم شیعرە دوای ساڵی ۱۹٤۹ دانراوە، لەبەرئەوە بەیادکردنەوەی قوناخێکی سیاسی، یان بەشێوەیێکی ئەو قوناخەی ئەزانێت! بڕوانە دکتۆرانامەکەی: (الواقعیە فی الادب الکردی ص۱۰۹) لەکاتێکدا ئەم شیعرە لەساڵی ۱۹٤٦دا وتراوەو باسی بەسەرهاتی دڵشەوەیستییەکەو هیچیتر.
3. لەچاپی یەکەمدا (سەرگوزشتە) نوسراوە.

قلیمی پڕ لەناسۆری هەرەسهێنانی لاویمە
تروسکەی تیا بەدی ناکەم، سەرنجم چەندە لێداوە
لەتاپۆی نامرادیم و تەمی ناسۆریی بەولاوە
ئەوی ئەوساکە رووناکیی ئەدا بەم ژینە شێواوە[4]
دڵێکی پڕ لەئاهەنگ بوو، کە ئێستا پاکی رووخاوە

* * *

بەڵێ ئەوسا دڵێکم بوو، کە سەرچاوەی ژیانم بوو
دڵێ مەڵبەندی ئاوات و تەوژم و تینی گیانم بوو
دڵێ گوڵزاری دڵداری و بەهەشتی خۆشەویستی بوو
وەکو بتخانە مەیدانی بتی جوانیی پەرستیی بوو
لەگەڵ هاوارو گریانی هەژارانا لەشینا بوو
لەگەڵ ناڵەی کەساسانا لەخورپەو راچەنینا بوو
لەژێر سایەی ئەوینێکا، هەموو سیحرێکی پۆشی بوو
لەکونجێکی خەراباتا[5]، خەریکی بادەنۆشی بوو
دڵێ بوو دارو دیواری هەموو مەستی نیگارێ بوو
هەموو سوچێکی دەسکردی، بەڵێنی تاقە یارێ بوو
دڵێ، خونچەی تەمای وابوو، لەخۆشی ئەو دەمی وا کا[6]

---

[4] لەچاپی یەکەمدا نوسراوە (ئەوی یەلە تۆزە رووناکی ئەدا...). بیرمە من لەبنەڕەتدا وتبووم: (ئەوی ئەوساکە رووناکی ئەدا...) بەڵام کە بۆ کاک (مەحموود تۆفیق)م نوسییەوە، خۆم ئەو دەستکارییەم کردبوو، کە ئێستا ئەو دەستکارییە بەڕاست نازانم.

[5] خەرابات: مەیخانە.

[6] دەمی واکا: دەمی بکاتەوە.

که تیشکی ئەو لە لێویدا، گولاّوپرژێنی دنیاکا
دڵێ، ئامادەبوو، تاری، هەزار ئاوازی لێ هەستێ
بەمەرجێ گوڵبەدەم جارێ بەمەستیی لێی بدا، دەستێ
تەلاری دڵ، کە دیواری وەها مەستی ئەوینی بوو
لەباوەش گرتنی بالاّی، هەموو ئاواتی ژینی بوو
گوڵ و گوڵزاری دڵ وابوو خەیاڵی رۆژو هی شەویان
(کەوا پرشنگی دوو چاوت، برێژێ چاوی بێ خەویان[٧])
وەنەوشەو نێرگزو شەوبۆ، هەموو سەرخۆشی تاسەی بوون
لەتەك سروەی بەیانیدا تەماداری هەناسەی بوون
هەناسەی ئەو، کەبێ، رایانژەنێت و ماچی کا، روویان
کە دایبێنێ، لەجێی سروەی بەیانی، زوڵف و گێسوویان
هەموو پێکێکی مەینۆشیی، بەیادی ئەو، کەپڕ مەی بوو
لە مەیخانەی دلاّ کەیلی بزەی ئەو جووتە لێوەی بوو
هەموو پاڕانەوەی وابوو، بەشێوان و سبەینانێ
کە رۆژێ لێوی پڕتاسەی، لەسەردوو لێوی ئەو دانێ

* * *

کەچی ئەو کۆشکی چەند ساڵەی، دڵم بنچینەکەی دانا
بەتەنیا گەردەلولێکی (نەهاتیی)، چوو بەئاسمانا
هەموو ئەو نیازو ئاواتەی، لەناو ئاخی دەروونابوو

---

(٧) سەرچاوەی ئەم نیوەبەیتە لەشیعرێکی (میخائیل نوعەیمە)وە وەرگیراوە (کحل اللهم عینی بشعاع من ضیاك کی ترالە).

لەداخی بێ بەڵێنیی ئەو، بەجارێ تەفر و توونابوو
بەڵێ، کاتێ بەخۆمزانی، بەهاری پڕ ئەوین ڕۆیی
خەرو ئاواتی چەند ساڵەو بەڵێنی پێ گەیین ڕۆیی
گەلێکم پشکنی دنیا، لەدووی ئەو جورتە لێوەی ئەو
هەزار ئەفسوس! ئەئەو ڕۆژەم بەدی کرد و ئەشێوەی ئەو
نە پرشنگی لەخونچەی دا، نەپەنجەی دا، لەتاری دڵ[8]
نەبەژنی شۆخ و شەنگی بوو بەمیوانی تەلاری دڵ[9]
نەچاوانی گوڵی ڕشت و نە کلچێوکێکی پیاهێنا
نە پرچی نێرگزی مەست و، وەنەوشەی شینی داهێنا
نە پێکی نایەسەرلێو و، نە بیستم ڕازی شیرینی
نە ماڵئاوایی لێکردم، نە ئیتر شێوەییم بینی

* * *

بەڵێ ئەو خونچەیەی چەند مەنگ پەشۆکابوون لەژێر پێیدا
خەوی ڕۆژۆشەوی وابوو گزنگی چاوی تۆ لێیدا[10]
کە چاوی تۆی نەدی شێوا، لەداخا کوڵمی خواکردی
گەڵاکانی وەکو عومری منی بێچارە با بردی[11]

[8] لەم بەیتەوە، بەتێکرایی وەڵامی بەیتەکانی پێشوو دەست پێ ئەکات، بۆ نموونە: نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە، پەیوەندی بەبەیتی دەیەم و یانزەیەمەوە هەیە.

[9] ئەم نیوەی دووەمەش، وەڵامی بەیتی دوانزەیەمەو تکام وایە لەبەیتەکانی تریشدا بگەڕێنەوە بۆ بەیتەکانی دوای بەیتی دوانزە... هتد

[10][11] لەم دوو بەیتەوە، جارێکی تر وەڵامی بەیتەکانی پێشوو، یەک بەیەک دەست پێ ئەکات، بەڵام بەدرێژی (بڕوانە بەیتەکانی دەیەم و بەیتەکانی دوای ئەو)

ئەی دڵ، چەندە سەیری کرد، کە پەنجەی تۆی ئەدی چاوی
دەروونی بوو بەگۆڕیچەی هەموو ئاوازی تاساوی
ئەلاری دڵ کە ڕۆشن بوو، بەوەی تۆ بی بەمیوانی
هەواری چۆڵ و هۆڵی بوو بەگۆڕی گردی سەیوانی[12]
کوڵی باخی دڵم، چاوی، بەدووی تۆدا ئەوەند گێڕا
هەتاکو چاوەکەی خۆشی، لەدەوری چاوی تۆ گێڕا
وەنەوشەو دەستە خوشکانی، لەبێ مەیلیی هەناسەی تۆ
هەناسەی دەرنەچوو دەمیان و تاساشن، لەتاسەی تۆ
وە یا ئەو پێکە ڕەنگینەی کە هەر نەیبیست لەتۆ دەنگێ
لەداخا بادەکەی ڕشت و، سەری خۆی دایە بەر سەنگێ
لەپاشا، گەردوتۆزقاڵی، کە وەك کەرتی دڵی من بوو
یەکی ڕووی کردە سوچێك و لەتاریکی شەوا ون بوو

* * *

بەڵێ، ئێستا ئەوی جێماوە بۆ من، یادگارێکە
بەسەرهاتی دڵی وردو بەسەرچوونی بەهارێکە

(لەساڵی (١٩٤٦) دا وتراوە و
لەنیسانی (١٩٨٣)دا تەواوکراوە)

---

[12] گردی سەیوان: گردێکی بچووکە و گۆڕستانی شاری سلێمانییە، کەوتۆتە باشووری خۆرهەڵاتی ...ەوە.

## شانزە ساڵ چاوەڕوانیی(١)

دوێنێ لەتەک ئەمانی سووراییی خۆرنشینا
کەشەو هێواشێ باڵی، کێشا بەسەر زەمینا[٢]
تۆماری شانزە ساڵی ژیانی خۆشەویستیم
ئاواتی پڕ لەتاسەی دەروون و گیانی برسیم
بەجارێ ئایەچاڵی ژیانی پڕ سزاوە
کە شەوقی چەندە گەنجی هەژاری تیا ڕزاوە[٣]
لەتەک هەموو عەزاب و ژیانی بێ هیوادا

---

[١] ئەم شیعرە کە لەساڵی ١٩٤٨دا وتراوە، یادکردنەوەی خۆشەویستییەکی سەرەتای هەرزەکارییە (موراهەقە) کە لەساڵی ١٩٣٨دا کۆتایی هاتووە! واتە: لە کاتێکدا وتراوە کە هیچ تین و شوێنەوارێکی ئەو خۆشەویستییە لەدڵ و دەروونمدا نەماوە. بەڵام گێڕانەوەی بەسۆزی بەسەرهاتێکی لەمێژینەی خۆی، لەلایەن هاوڕێیەکی ئەوسامەوە، بوو بەهۆی دانانی ئەم شیعرە، کە لەدەرفەتێکی تردا باسی ئەکەم.

[٢] لەچاپی یەکەمدا، لەباتی (کێشا بەسەر زەمینا) نووسراوە: (کێشا بەرووی زەمینا).

[٣] کاکەی فەللاح لەنێوان بەیتی سێیەم و چوارەمدا ئەم بەیتەی نووسیووە:
(دوێنێ کە وەلە بڕایم، بەکوێری دائەنیشتم
لەپڕ بەخۆری جوانیت، لەبووتی خوا، گەیشتم)
لەپێش هەموو شتێکدا: (دوێنێ کەوەلە بڕایم...) نییە، بەڵکو ڕاستییەکەی:
(ئەوسا کە وەلە بڕایم...)ە، جگە لەوە ئەم بەیتە، سەرەتای کۆپلەیەکی تازەیە، ئەکەوێتە دوای بەیتی شەشەم، بەڵام لەبیرنەوەی لەکاتی خۆیدا لەوارم نەکردبووە، فڕێدانیم بەڕاستتر زانیوە. باسی ئەوە لێرەدا ناکەم، کە ناوەرۆکی ئەم بەیتە، وێنەیەک ئەکێشێت، کە پێچەوانەی وێنەی شەش بەیتەکەی سەرەوەیەو، ئەبوو (کاکەی فەللاح)، هەریەوەدا بیزانیایە ئەو بەیتە ئەکەوێتە دوای شەش بەیتەکەی پێشوو. ئەڵێم: باسی ئەم حاڵە هەڵئەگرم بۆ شوێنی خۆی، بەم بۆنەیەوە پێویستە ئەوەبڵێم کە مەبەست لەوشەی (هەژار) لەم بەیتەدا (بەسەرزمان)ە نەک ئەو هەژارەی (کاکەی فەللاح) لە (کاروانی ل ١٥٩)دا باسی ئەکات، وەک لەشوێنی خۆیدا بەدرێژی لێی ئەدوێم.



PDF 4 KURD

ئەم رەنجی ساڵەهایەم، کە گشتی چوو بەبادا
لەتەك ئەمانەشا، من، هەرچەندە تێگەییشتووم
کە دووی خەیاڵی دووری، پەری نیگارێ کەوتووم
لەکانی قووڵی دڵما کە بۆتە گۆڕی ئاوات
ڕژاوە نەقشی باڵای بڵندی ئاڵو واڵات

عەبابەیلێ / ١٩٤٨



PDF 4 KURD

# پێنج خشتەکی لەسەر غەزەلێکی (شێخ نووری(١))

(١)

قەت نەدەی ئازاری گیانی مەست و بێدارانی شەو
خۆت نەخەیتە بەر شەپۆلی ئەشکی بێ پایانی شەو
ئەی کچی خوارەندی جوانیی و ئەی چرای دیوانی شەو
(خۆت بپارێزە لەئاهی دڵبریندارانی شەو[٢]
نەك خوا ناکەردە گیرابێ دووعای ئاڵانی شەو)

(٢)

وێڵم و تاریکە دەورم، فەرشی ڕێگەم مەینەتە
بێ کەسم، تەنیا ئەناڵم، مەرگی خۆمم عەزرەتە(٣)
سازی ئاهەنگی شەوانم، سۆزی جەرگی لەت لەتە
(یاوەرو یاری ئەنیسم ئاهو ئەشکی حەسرەتە
ئافەرین ئەی بارەکەڵڵا، دیدەیی گریانی شەو)

(٣)

وانەزانی دەستی خەم یادت لەدڵدا دەرئەکا
ئەشکی خوێنینم دەلیلە بۆ کەسێ باوەڕ نەکا
گیانەکەم بەو تیشکی چاوەی شەڕ لەگەڵ ئەختەر ئەکا
(دڵ ئەبێتە قەترەیێ خوێن و لەدیدەم سەر ئەکا
هەر کەڕابووری بەدڵما سوحبەتی جارانی شەو)

---

[١] شێخ نووری شێخ ساڵح (١٨٩٨– ١٩٥٩) یەکێکە لەشاعیرە گەورەکانی ئەم چەرخی دوایییەی ئەدەبی کورد (بڕوانە شیعرو ئەدەبیاتی کوردی_ نووسینی ڕەفیق حیلمی_ بەرگی دووەم_ بەغدا_ ل١٩٩–٢٠٨).

[٢] سێ دێڕەکەی پێشەوە هی منەو دووەدێڕی تر کەوانەکە هی خوالێخۆشبوو شێخ نوورییە.

[٣] لەچاپی یەکەمدا (تەنها ئەناڵم) نووسراوە، کە (تەنیا) ڕاستترە (بڕوانە پێشەکی ئەم دیوانە).

PDF 4 KURD

(٤)

هاودەمێ فەرمووی: لەبەرچی کردەوەت گریانەهەر؟
نافی لاوێتیتە، لاویی، قەڵبەزەی سەیرانە هەر
من وتم سەیران و خۆشی پێشکەشی شادانە هەر
(ئەشکی حەسرەت لازمی جەمعی سیابەختانە هەر
شەونمی سوبحە دەلیلی قەترەیەک گریانی شەو)

(٥)

هەوڵی زۆرم دا، لەداوی زوڵفی ئەو بێ مروەتە
دەرچم و دوایی بهێنم، بەم عەزاب و مەینەتە
پێی وتم بێ سوودە هەوڵت، تاکو ماوی جێگەتە[٤]
(نووری لەم پێچ و خەمی زوڵفە نەجاتت زەحمەتە
لای سەخی تەبعان مەحاڵە روخسەتی میوانی شەو)

هەڵەبجە / ١٩٤٨

(٤) ئەم دێڕە لەچاپی یەکەمدا لەبیرچووە.

PDF 4 KURD

## (چەپکە گوڵێك بۆ "ست فاتمە")

فاتمە[1]، دووچاوی مەستت، پڕ تەلیسمی جوانییە
پڕ شەرابی خۆشەویستی و عارەقی یەزدانییە
بەژن و باڵاکەت نموونەی هەیکەلی یۆنانییە
لارو لەنجەت مۆسیقایە، بەستەیە، گۆرانییە
بووکی رازاوەی خەیاڵم، گیانەکەم ست فاتمە
تاقە پرشنگێکی چاوت ئەوپەڕی ئاواتمە

* * *

گەرچی دڵداریی لەخاکی ئێمەدا، ئەفسانەیە
هەر بەتەنیا بۆ کوڕی خاوەن تەلارو عانەیە
گیانەکەم، ئەمما دڵی من لەودڵە شێتانەیە
بێ ئەوەی هیچ شك بەرێ، کوژراوی ئەو چاوانەیە
هەر بەتەنیا خۆشەویستیی شك ئەبەم، ست فاتمە
سەروەتم ناوێ، بزەی تۆ ئەوپەڕی ئاواتمە

* * *

خۆشەویستیی وا کەنامەی خوایە بۆ پێغەمبەران
بەرزو ناسك، وەك هەناسەی پڕ گوڵاوی دولبەران
نەك وەکو حەزکردنی دینارو گەوهەر پەروەران
ئەو کەسانەی بۆ قڕانێ، چەندە دڵیان هەڵوەران

---

[1] لەچاپی یەکەمدا (فاتیمە) نووسراوە. بڕوانە (رازی تەنیایی _ ل٢١)

خەڵقی تر، پارەپەرستیی، بابکەن، ست فاتمە
من بەتەنیا، تۆ پەرستیی ئەوپەڕی ئاواتمە

*      *      *

زۆر کەڕەت هاتم نەدا، داخی دەروونی پڕ گڕم
بۆتی هەڵڕێژم سکاڵای ئاسکی گەرم و گوڕم
داخەکەم، کاتێ کەدێمە بەردەمت، واقی وڕم
وام ئەشێوێنێ بەجۆرێ نایەڵێ هیچ دەربڕم
بووکی رازاوەی خەیاڵم گیانەکەم ست فاتمە
گوێیە بۆ ئەم ڕازە شل کەی، ئەوپەڕی ئاواتمە

سلێمانی/ ١٩٥٠



PDF 4 KURD

# (دوو چەشن دڵداریی)

ئەم شیعرە لەچاپی یەکەمدا ناوی (دڵداریی کچی تازە)یە[1]،ئەگەرچی لەبنەڕەتدا ناوی (دووچەشن دڵداریی) بوو، هەروەها ئەم شیعرە (هەمان چیرۆکی خۆشەویستیی) من نیە، وەك (کاکەی فەللاح) ئەڵێ...!

*　　*　　*

ئەم دڵەی وەك بت پەرستێ روو ئەکاتە چاوەکەت
نوێژ ئەکا بۆ تیشکی چاو و زوڵفە تێك ئاڵاوەکەت
گەرچی ئەیشێلی بەزەبری قۆندەرەو پێلاوەکەت
قەت بەدڵڕەق باست ناکەم، نایزڕێنم ناوەکەت
چونکە ئەیزانم تەلاری یارە خوا پێداوەکەت
مەستی کردووی، بۆیە نابینێ لە عاستم، چاوەکەت

*　　*　　*

باخەوان بۆئەو مەبەستە گوڵ ئەلاوێنێتەوە
بۆئەوەی گەورەی بکاو بۆ پارە بیگۆڕێتەوە
بیفرۆشێ بەو کەسەی خەڵقی ئەڕوتێنێتەوە
بۆئەوەی مێزی شەرابی پێ برازێنێتەوە
کچ لەلای ئێمەش گوڵێکە، بۆیە پەروەردەی ئەکەن[2]
تا برازێنێتەوە مێزی شەرابی دەوڵەمەن

*　　*　　*

---

[1] بڕوانە چاپی یەکەمی (رازی تەنیایی_ ١٩٥٧_ ل٣٦).
[2] لەچاپی یەکەمدا نوسراوە (کچ لەلای ئێمە).

رەنگە لات وابێ کە گوایە یارەکەت مارەت ئەکا
یا بە خەیبانووی تەلاری بەرزی ئەم شارەت ئەکا
ئەم خەیاڵەت خاوە، تووشی داوی ئەو مارەت ئەکا
چونکە وەك گورگێکە مەیلی ئەو لەش و لارەت ئەکا
ئەو بەتەنیا بۆ گوڵی سەرمێزی بادەی[٣] تۆی ئەوێ
هەر کەجارێ بۆنی کردی، جا گوڵێکی نوێی ئەوێ

* * *

ئەو، گوڵی بۆ مێزی بادەو پۆکەرو یاریی ئەوێ
واتە تۆی بۆ تێپەڕینی کاتی بێزاریی ئەوێ
من، گوڵم بۆ تۆوی باخی ژین و دڵداریی ئەوێ
یانی من، تۆم بۆ ئەوینی عومری یەکجاریی ئەوێ
تۆم ئەوێ وەك گوڵ لەباخی ماڵی مندا هەڵبدەی
نەك گوڵی سەر مێزی ئیمڕۆبیت و پێخوستی سبەی

* * *

من، ئەوینم هێنی عومرەو، هی خەوی شەوگارنییە
وەك خەوی خاوەن تەلارو خاوەنی دینار نییە
هەربووەو هەرگیز ئەمێنێ، هێنی جاروبار نییە
ئاوی لێڵی کوێرەشیوێ چەشنی هی رووبار نییە
جا ئیتر من وا قسەی خۆم پێ گەیانی، بێ درۆ
حەز ئەکەی هەروەك پەپوولە روو لەئاگرکەو برۆ

**لەساڵی ١٩٥٠ دا وتراوەو**
**لەساڵی ١٩٨٣دا تەواوکراوە**

---

[٣] بادە: شەراب، مەی.



PDF 4 KURD

# تەپڵی بەتاڵ

ئەم شیعرە لە ساڵی ١٩٥١دا وتراوە، بەسەرهاتی کابرایەکی رووخاوە کە لەسەردەمی (پاشایەتیدا) رووناکانە کۆشکێك و لەوێ روخانی خۆی مۆرنەکات و دوای ئەوە بەرزی ئەکەنەوەو ئەبێت بەخاوەن پایەیەکی بەرز..

بەڵام (کاکەی فەلاح) لەواونەکردنی ئەم شیعرە بەهەڵ ئەزانێ، بۆئەوەی ئەم شیعرە بەئارەزووی خۆی لێك بداتەوە.

(وەمزانی کە نامووس و حەیا نرخی کوڕانە[1]
راستگۆیی و وڵات پەروەریی، ئەنجامی ژیانە
ئەمزانی براکەم، هەموو ئەم ناوەزلانە
وەك تەپڵی بەتاڵ، گەرچی زل و گەورەیە، دەنگیان
دەسکردی خەیاڵن، لەژیانا نییە رەنگیان)

* * *

(ئەمزانی ئەتیکێتی سەدەی تازە، ڕیایە!
ئادابی لەلایە ئەوی وەك لۆتی وەهایە
فێزی ئەم و ئەو هەڵنەپەڕێنێ بەسەنایە
کێ باوی هەبوو، نۆکەرە ئەو، گوێ ئەلەقێنێ
مەیمونە، تەشی رێسە، بەدڵ پیاهەڵئەخوێنێ)

* * *

[1] (کاکەی فەلاح) (کوڕانە)ی کردوە بە (گرانە)، ئەوەش سەیرتر ئەوەیە، لە پەراوێزیشدا ئەڵێت (لەچاپدا بەهەڵە (کوڕانە) نوسراوە ئەگینا (گرانە)یە. (کاروانی شیعر، ل١٤٦، پەراوێزی٨).



PDF 4 KURD

[illegible] ئەڕۆیشت و لەبەرخۆیەوە ئەیووت
[illegible] یا کەنەبی ئیستەکە دەمکوت
[illegible] کەڵ چۆنی ئەڵێم، وایە کوت وەت
[illegible] پارە تەشی رستنە پیشەی
[illegible] نۆکەرییە، کاری هەمیشەی)

* * *

[illegible] ساڵە، لەرێی ئەم گەلەدا، من کەئەسووتێم
[illegible] نرخی نەزانیم و هەتا تۆ نەگەیی لێم
[illegible] سەرقە کە میللەت ئەمەبێ، بیخەمە ژێر پێم
هەرچەندە بەسەرزاریی ئەبێ گەڵ مەبەسم بێ
تۆ شوێنەونیی، بەرزیی ئەو گورزی دەستم بێ![1]

* * *

تاوا بەرق و کینەوە هەنگاوی ئەنا بۆی
بیلانی ئەکێشا بەخەیاڵ و خەوی بێ شۆی[2]
تا کەییە تەلارێك و کەمێ هاتەوە سەرخۆی
وەك دوودڵییەك، قاچی ببەستێتەوە تاوێ
وەستا، ولەپاشا، چووە ژووری بەشەقاوێ

* * *

---

(1) ئەم بەیتانەی لەنێوان دوو کەوانەدان، قسەی کابرای ڕووخاوە کە ئەڕوا و لەبەرخۆیەوە ئەو قسانە ئەکات و قسەکان لێرەدا تەواو ئەبێت.

(2) بێ شۆ: بێ ئەندازە، لە ئەندازە بەدەر. بڕوانە (دیوانی مەولەوی: لێکدانەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس، بەغدا، ١٩٦١، ل٣٣).

PDF 4 KURD

لەو رۆژەوە هەرچی کە ئەزانی و نەئەزانی
لەو کۆشکە هەڵی رشت و فرۆشتی بەنیهانیی
کۆتایی بەژینی لەوەپێشی، بەوەهانی
لەوساوە قەڵەمبازی ئەدا پایە بەپایە
بۆ هەڵمەتەکاسەی گەلەکەی، بوو بووە سایە[٤]

* * *

ئینجا کە گەیی ئەو بەپلەو پایەیی ئەمڕۆی[٥]
کۆبوونەوە لێی پایەپەرستانی وەکوخۆی
تاکو بەتەشی رستن و بادانی درۆ بۆی
سەودا لەپەنایا بکەن و (جن) بفرۆشن
پارووبگلێنن بەشەو و بادە بنۆشن

* * *

شەو مێزی شەرابی کە ئەڕازایەوە بۆ کۆڕ
رووناکی ئەبەخشی لەشەودا، ویسکیی سەرمۆر
جا پێك و سەری گەرم و قسەو بابەتی سەدجۆر
هەر پەخشی ستایش بوو بەسەرکاکی بەڕێزا
هەر گوڵ ئەکرا، جا، بەیەخەی خاوەنی مێزا

* * *

---

(٤) سایە: سیبەر. هەڵمەتەکاسە: مرۆڤی چارچنۆکی خۆتێهەڵقورتێن و بێ چاوڕوو. بڕوانە (فەرهەنگی خاڵ ٣: ٤٣٠، سلێمانی ١٩٧٤ تەتاوەوە ١٩٧٦؛ لەبیرکی فەرهەنگەکە نووسراوە).

(٥) پایەیی ئەمڕۆی: مەبەست ساڵی ١٩٥١ کە شیعرەکەی تێدا وتراوە، چونکە باسی کابرایەکی رووخاوە لەسەردەمی پاشایەتیدا.

...ا ئەنەبوو، یا خەفەتێ کاری ئەکرد تێی
...ن کە قسەی هاودەمەکەی دێتەوەبەر گوێی
...م شێوەیە، ئەیخوێندەوە، ئەو نامەیە بۆخۆی[٦]:
(فەرمووتە ئەوەی خزمەتی ژێردەستی مەبەست بێ
...ویستە وەکو ئێوە مەزن بێت و بەدەست بێ)

* * *

(پاکانە ئەکەیت بۆ هەوەسی ئەرسن و برسیت؟!
کوایا کەلەبەر خزمەتی گەل، عاشقی کورسیت؟
کورسیت کەهەبێ، دادی گەلی لێوە ئەپرسیت؟
قوربان! بەچ ڕەنگ پێت ئەکرێ خزمەتی کونجێ
تا سودی لەگەڵ سودی سەری گەورە، ئەگونجێ؟)

* * *

(خۆ گەر بیەوێ ئەو سەرە، پیلانێ بتاشێ
یا بۆ گەلەکەت، سازی بکا کورە و ئاشێ
ئەیبینی کەلەم دامەیەدا، ئەتکەنە داشێ
ئەوسا مەزنیت دەرئەکەوێ، خەون و خەیاڵە
ئەو گەورەییەی ئێوە وەکو تەپڵی بەتاڵە[٧])

* * *

---

[٦] ئەو بەیتانەی دوای ئەم دێڕە خراونەتە ناو دووکەوانەوە، نامەی هاودەمی کابرای ڕووخاوە، کە بۆکابرای ڕووخاوی ناردووە، بەقسەکانیدا دەرئەکەوێ کە نامەی هاودەمەکەی لەوەڵامی نامەیەکی کابرای ڕووخاودا نوسراوە.

[٧] لێرەدا نامەی هاودەمەکەی تەواو ئەبێت.

هەرچی وتبوو هاودەمەکەی، گشتی وەهابوو
پیلان و گەل و رۆڵەیی گەل، ئاگر و کابوو
بۆ سودی کەسانێ، ملی چەند رۆڵە شکابوو
لەم نەقشەیەدا، کاکی مەزن، پیادەیی شابوو[٨]
لافی مەزنی و گەورەیی ئەو، هەروەکو بابوو

* * *

ئەوسا قسەکەی هاتەوە گوێ، زۆر بەزوڵاڵی
(تۆ دەنگی دەهۆڵێکی، وەیا تەپڵی بەتاڵی!)

لەساڵی ١٩٥١دا وتراوەو
لەساڵی ١٩٨٣دا تەواوکراوە

---

[٨] پیادەی (شا) لەیاری (شەترەنج)دا، هیچ دەسەڵاتێکی نییە، هەرئەبێ سنگ بنێ بۆ پێشەوە.

## چاوەڕوانیی بێ هوودە

هەموو ڕۆژێ لەبەرسەیری بتی ئەو بەژن و باڵایە
لەسەر ڕێدا ئەوەستم من، هەتاکو ئاوی پێم دایە
بەدووچاوێ کە شەوقی چاوەڕوانیی ئەیتروکێنێ
بەدوو چاوێ کە سیڕی قووڵی لاوێتیی، ئەدرکێنێ
سەرنجی ڕێ ئەدەم، ڕێگا، هەموو شێوەی ئەوی تیایە
وەکو دنیا لەناوجوانیی ئەوا توابێتەوە، وایە
شنەی با، باسی جوانیی ئەو، بەگوێی مندا ئەچرپێنێ
هەموو دەرکەوتنی شۆخێ، دڵی من دائەخورپێنێ
بەڵام خورپەی تەوای دڵ لەگەڵ هەنگاوی ئەودایە
کەسەرتاپا لەئاوازی بەهەشتی خواوە. پەیدایە
بەڵێ، کاتێ کە ئەو دەرکەوت، ئیتر من بێ سەروشوێنم
بەتیشکی خۆری جوانیی ئەو، بەجارێ قوڵپ ئەدا خوێنم
وەکو چۆن ئەونەمامێ، گەردەلوول ئەیبات و ئەیهێنێ
لەشم موچڕکی دڵداریی، وەها ئاخی ئەبزوێنێ
ئەگەرچی وەک خەیاڵی من عەبا دەوری لەشی داوە[1]
لەئەندام و لەش ولاری بڵند و ڕێکی ئاڵاوە
بەڵام کاتێ کە با چمکی عەباکەی لائەدا، تاوێ
ئەڕێژێ پووزی ئایابی، لەسیحری خوایی، لافاوێ

**سلێمانی/ ١٩٥١**

---

[1] ئاشکرایە کە لەم بەیتەوە (کۆپلە)یەکی تازە دەست پێ ئەکات بەڵام کاتی خۆی پێم تەواونەکرا.

PDF 4 KURD

## (رازی تەنیایی)

ئەم شیعرە هەرچەندە لەساڵی ١٩٥١ دا وتراوە بەڵام شیوەتیکە، یان ئاوڕدانەوەیەکە لە قۆناخیکی لەوەپیشتر. واتە لەم ڕووەوە، تا ڕادەیەك لە (شاتزە ساڵ چاوەڕوانیی) ئەچیت وەکو لەو نامیلکەیەدا، باسی ئەکەم کە ئەکەوێتە دوای ئەم دیوانە.

ژیان و ئەرکی ناخۆشی پەپوولەی ئارەزووی کوشتم
شەرابی جامی دڵداریی، لە تافی لاوییا ڕشتم
تەمی ڕۆژانی پڕ مەینەت، وەها تاریك و چڵکن بوو
نیگاری خۆشەویستی دڵ، پەری ئاسایی، تیا ون بوو
شەوی تەنیایی، ڕووناکیی چرای ئاواتی، خنکانم
دەسی ناکامیی، ئاوازی دەروونی کەیلی، تاسانم
ئەوا ئیستا لەگەڵ زامی
دەروونی پڕ لە ناکامیی
ئەپێوم چۆڵی سەرسامیی

*　　*　　*

لەتەنیایی شەوی ژینا، ئەنێم هەنگاوی کوێرانە
نییە دەستێ، دەرمبێنێ لەناو ئەم گۆڕە وێرانە
نییە جوانێ، سەری کاسم، بنێمە سەردڵی نەرمی
کە هیلاکی لەشم دەرکا، خەوی سەرباوەشی گەرمی
ئەگێڕم چاوی بێ تینم، بەتاریکی شەوا، سەرسام

نییە پرشنگی دوو چاوێ، کە ڕووناکی بکا، ڕێگام
دەمەبیری باڵی غەمناکی
شەوی پڕ ترس و سامناکی
نییە یەک تۆزە ڕووناکی

*　　*　　*

نییە تەنیا پەریزادێ، کە پاڵم پێوەنێ، نازی
کەبەهرەی سیس و ژاکاوم، ببوژێنێتەوە، ڕازی
تریقەی ئەو، تەمی ئەم یەئسە ڕامالێ لەسەرچاوم
وەکو لایلایە ژیری کا، دڵی منداڵی گریاوم
بەڵێ گوێ هەڵنەخەم، بێجگە لەخورپەی سست و لێدانی
دڵی پەستم، کە نووزەی دێ بەعاستەم ڕازی پەنهانی
نییە هەردەنگی هیچ نایێ
لەهیچ شوێنێ لەهیچ لایێ
شەقەی باڵێ شنەی بایێ.

سلێمانی/ ١٩٥١

## صلوات المحب[1]

منذ أن أشرقت في دنيا الغرام
تسكبين السحر في جفن الوجود
بت كالنشوان من خمر الهيام
انطق القيثار من لحن الخلود

* * *

يا مثال الفن يا طيف الإله
في حنايا من فؤادي المعبد
بسمه ترنو على تلك الشفاه
تغمر الدنيا بنور سرمدي

* * *

بسمة توحي لأذهان الزهور
سر ذياك الغدير الناعس
تنعش الآمال، نشوى بالحبور
في فؤادي المستهام اليائس

* * *

فابسمي كالزهر في وجه الصباح
أو كآمالي التي لا تنتهي

---

(١) لەکاتی خۆیدا خالید سەعیدی هونەرمەند ئەم شیعرەی لەگۆڤاری (الهاتف)ی (نەجەف)دا بڵاوکردەوە، لەگەڵ سەرەتایەکی ڕۆمانسییانەی ژیانی منداڵ، داخەکەم ژمارەی گۆڤارەکەم ساڵی دەرچوونیم لەبیرنەماوە، هۆی دانانی ئەم شیعرە لە پێشەکی ئەم دیوانەدا باسکراوە، تکایە سەرنجی بدە.

واسكري العشاق بالخمر المباح
من ثنايا ذلك الثغر الشهي

*    *    *

تعرك السابح في موج السنا
فاض من وجه سماوي وديع
دافىء كالشوق في جفن المنى
رائع كالسحر.. كالفن الرفيع

*    *    *

وجهك.. أو اه .. ماجدوى الكلام؟
في جمال.. لج في.. أسراره
ان سر الحسن في ذاك القوام
تعجز الأقلام عن اظهاره

*    *    *

فانظري قد ضاع هذا العابد
في الدياجي وحده صنو السقام
بات يكفيه شعاع واحد
من سنا عينيك في هذا الظلام

بغداد/ ١٩٥١



PDF 4 KURD

## ئۆباڵی خۆت بەئەستۆی خۆتە[1]

بەدەستی خۆت، کە جامت خستە سەرلێوت غەشیمانە
ئەگەر زەهریشی تێدابوو، گوناهی خۆتە بیزانە
هەڵە یاخود گوناهت کرد، لەکاتێکا کەبێ هۆشی
سزاو تاڵاوی هەرچی بێ، ئەبێ وەك بادە بینۆشی
ئەگەر پیاویت و ئەیزانی، کەوا ئۆباڵی کردارت
لەئەستۆی وردی خۆتایە، ئیتر بێ سوودە هاوارت

١٩٥٣

(١) ئەم شیعرە سەرەتای چیرۆکێکە، کە داخەکەم کاتی خۆی تەواونەکراوەو ئەو سێ بەیتەی لێرەدا نوسراوە، قسەی قارەمانی چیرۆکەکەیە، کە دوای ئەم قسانە خۆی ئەکوژێ. داخەکەم تەواونەکردنی ئەمیش، بوو بەهۆی ئەوەی گەلێک قسەی نارەوای دوابخرێن، و هەرکەسێک بەباری دڵی خۆیدا لێکی بداتەوە، بۆئەوەی چاکتر لەم چیرۆکە بگەیت، تکایە بڕوانە پێشەکی ئەم دیوانە.

## خەرمانە[1]

چ سرێکت لەناودڵدا، حەشارداوە بەپەنهانی
کە چاوت چەشنی ئاوێنە وەهابێ پەردە درکانی
نەزانم دڵ هەیە، وەک مس، کە ژەنگ دێنێ بەئاسانی
دڵی تۆ زێڕی تێزابە لە کوێوە ژەنگی هەڵهانی؟
ئەمانە گەرچی تێ ناگەم، بەڵام پێویستە بیزانی[2]
هەتا ماوم لەدنیادا، فریشتەی باخی ئاواتم
بەدڵ هەرچەشنی خەرمانە، لەدەوری مانگی گۆناتم

١٩٥٣

[1] ئەم شیعرە لەچاپی یەکەمدا (رازی تەنیایی ١٩٥٧ :ل٣٨) ناوی (من وتۆ)یە

[2] ئەم دێڕە لەچاپی یەکەمدا لەبیرچووە.

## پەیامی یار[1]

لەیارەوە
لەشۆخ شەنگی پارەوە
لەرازی .. پڕ نیهانی یا
لەتەك شنەی بەیانی یا
پەیام لەیاری جوانەوە
گەیشتەلام

* * *

بەرامەکەی
گوڵاوی باخی نامەکەی
کە ئاوی زیندەگانی یە
شەرابی کامەرانی یە
گوڵی هیوای ژیانەوە
گوڵی هیوام

* * *

چ نامەیێ ؟
چ پەنجەیێ چ خامەیێ؟
ئەوەندە دڵ ئەکاتەوە؟
خەفەت لەبیر ئەباتەوە
ئەخاتە ناخی گیانەوە
ئەزووی بەتام؟

سلێمانی / ١٩٥٨

---

[1] ئەم شیعرە لەچاپی یەکەمدا نییە، چونکە دوای دەرچوونی چاپی یەکەم دانراوە.



PDF 4 KURD

# بۆ سەر کێلی گڵکۆی ئازیزان

پاشکۆ، یان بەشی دووەمی رازی تەنیایی

PDF 4 KURD

پێشەکی

کاتێک کە (رازی تەنیایی) بۆیەکەمجار، لەچاپدرا، من تەنیا دوو چوارینە)م، بەبۆنەی مردنی دوو لاوی جوانەمەرگەوە دانابوو کە هەردووکیان لەچاپی یەکەمدا نووسراون. بەڵام دوای دەرچوونی (رازی تەنیایی) ناچاربووم تکای هەندێک برادەرو دۆستاوی بەرێزم بگرم و هەندێک چوارینی تری لەو بابەتە[1]، دانێم، جا لەبەرئەوە، وام بەچاك زانی، هەڵبژاردەیەکیان بخەمە دوای دیوانەکەوەو لەشیعرەکانی تری جیا بکەمەوەو ناوی بنێم (لەو سەرکێلی گڵکۆی ئازیزان)، چونکە هەریەکێکیان بەو مەبەستە دانراوە، کەلەسەر کێلی ئەوجۆرە کەسانە بنووسرێت.

شایانی باسە ئەو چوارینانەی بۆئەو مەبەستە دانراون، گەلێك لەوەزۆرترن کە لێرەدا نووسراون، بگرە لەوانەیە سێ ئەوەندەو چوارئەوەندەی ئەم چوارینانەی ئێرە بن، بەڵام هیچیانم لەبیرنەماوەو لای خۆشم نەنووسراوەتەوەو وەکو بیرم بێت، هیچیشیانم لەو پلەیەدا نەدیوە کە سۆراخێکیان بکەم، تاکو لێرەدا بینووسمەوە.

---

[1] لێرەدا مەبەست لەو شیعرانەیە کە لەسەر شێوەی چوارینە (رباعی) دانراون، ئەك لەسەر کێشی چوارینە کە کێشێکی تایبەتییەو لە (بەحری هەزەج) دەرئەهێنرێ بڕوانە (تاریخ الادب، من الفردوسي الى السعدي، للمستشرق (ا.ج براون) ترجمة د. ابراهيم امين الشواربي، مطبعة السعادة بمصر، ١٩٥٤، ص٤٨).

بەم بۆنەیەوە پێویستە بڵێم من هیچ شتێکم ئەوەندەی ئەوە پێ گران نییە، کەلەسەر داخوازی خەڵك شیعر دانێم، بەتایبەتی ئەو شیعرانەی لەسەرکێلی مردووان ئەنووسرێن، بەڵام لەگەڵ رووڵێنانی دۆست و ئاشنایاندا ئەڵێی چی؟! لەناو ئەو شیعرە کەمانەدا کە لێم ون بوون، تەنیا داخ بۆ (شیوەن)ەکەی (بێکەس)ی شاعیر ئەخۆم، کەبۆ یادکردنەوەی مامۆستای ناوبراو دامنابوو لە کۆبوونەوەیەکی سینەمای (سیروان)دا لە سلێمانی خوێندمەوە، داخەکەم لەگەڵ هەموو هەوڵ و تەقەللایەکدا بۆم نەدۆزرایەوە. لەکۆتاییدا هیوام وایە ئەم چەند چوارینە هەڵبژاردەیەشتان وەکو ئەوانی تر بەدڵ بێت..

١٩٨٤/٤/٢٢



PDF 4 KURD

بۆ (کەمالی جەلال سائیب) وتراوە، کە لە ١٩٣٨/٧/٢٤دا لە رانیە کوژراوە:

داخی ئەجەل هات و لەناکاو، دەفتەری ژینی دڕیم
تاکو دوێنێ خونچەبووم، ئەمڕۆ بەناهەق هەڵوەریم
وەک بروسکە ئەونەمامی داڕنێ، وەختی چرۆ
هات و گوللەی وێڵ[٢] لەناکاو[٣]، بێ گوناه جەرگی بڕیم

١٩٣٨[٤]

---

[٢] ئەوی راستی بێت گوللەی وێڵ ئەوەیە: کە لەلای لایەلایەوە کەسێکی بێ تاوان بکوژێت، هەرچەندە کەمال جوانەمەرگە زۆر بێ تاوان بوو و گوللەکەش بەتایبەتی ئاراستەی ئەونەکرابوو، بەڵکو ترابوو بەجێگەی یارکیەوە، کە بەرێکەوت ئەوی تێدانوستیبوو، بەڵام هەرچۆن بێت گوللەی وێڵی پێ ناو ترێ. لەگەڵ ئەوەشدا چونکە لەکاتی خۆیدا گوللەی وێڵم بەکارهێناوە نەمویست بیگۆڕم.

[٣] ئەوی من بیرم بێت لەسەرەتادا دێڕەکە وابوو: (هات و گوللەی وێڵ لەناکاو) بەڵام لەدوایدا گۆڕیم بە (لەشەودا) و لەخوێندنەوەدا هەر وتومە: (هات و گوللەی وێڵ لەشەودا)، بەڵام وادەزانم کەوێت لەکاتی نووسینەوەی شیعرەکەدا گەڕاومەتەوە بۆدەقی پێشووی، هەرچەندە (لەشەودا) بەڕاستتر ئەزانم، لەگەڵ ئەوەشدا نەمویست بیگۆڕم.

[٤] وەک لەمامۆستایان: (عەلی شەرەم، نیهال صاحب "برای کەمال")م بیستووە لەسەرکێلی قەبرەکە ساڵی ١٩٣٧ بەمێژووی کوشتنی دانراوە، بەڵام کاک نیهال ئەڵێت: بەپێی نووسینی جەمیل صاحب و مستەفا صائیبی مامی کارەساتەکە لەساڵی ١٩٣٨دا روویداوە: بەم بۆنەیەوە سوپاسی مامۆستایان کاک عەلی شەرەم و کاک نیهال صاحب ئەکەم.

بەزمانی (موحەممەد کەریم)ی هاوڕێمەوە وتراوە کە لەسەرەتای لاویدا، خۆی کوشتووە:

برام وا تێ نەگەی ناخم[٥]، لەداخی نائومێدیمە
ئەگەرچی زامی سەرسنگم نیشانەی جوانەمەرگیمە
بەڵام بۆیە دڵم بەرگوللەدا زانیم کەچی تیایە
دڵێ وێنەی کچی تیابێ، ئەمانی باشە بۆچیمە[٦]؟

١٩٥٣

بۆ (مەعتابی شێخ جەلال شێخ ڕەشید) وتراوە کە لەهەرەتی لاویدا جوانەمەرگ بووە:

کە ڕابووردی ،بەئەسپایی، لەسەرئەم گۆڕە پێ دانێ
کە مەعتابێکی تێدایە، مەگەر ئەو خوایە بیزانێ
لەباخی خۆشەویستیدا، گوڵاڵەی نەوجوانیی بوو
کەچی کاتی گەڵاڕێزانی ئەو، هێشتا بەیانی بوو

١٩٥٩

---

[٥] لەچاپی یەکەمدا: (برام وا تێ مەگە) نوسراوە کە هەڵەیە (برام وا تێ نەگەی) ڕاستترە.

[٦] (کاکەی فەلاح) کەباسی ئەم چوارینەیە ئەکات، وای پیشان ئەدات کە گوایە من بەزمانی ئەولاوەوە، شیوەن بۆ خۆم و بەسەرهاتی خۆم ئەکەم!! و گوایە دڵ بەر گوللەدان بەرەوا ئەزانم لەبەر ئەوەی وێنەی کچی تیایە!! جگە لەوەی بەرۆژنەیەوە، لێستەیەك تاوان و ناوزڕاندنێکەم، پێوەئەلکێنێ!! بڕوانە (کاروانی شیعر) ل(١٦٢،١٦٣) بێگومان ئەگەر تەمەن و ڕۆژگار یارمەتیم بدەن، لەنامیلکەکەدا وەڵامی پیاوانەی ئەم قسانە ئەدەمەوە، بەڵام لێرەدا تەنیا شیعری (خەرمانە) کەلەهەمان ساڵدا وتراوە ئەکەم بەوەڵامێکی سەرەتایی، بۆ ئەوە ئاوەڕووکا نی و ئەڵێم: کەسێك ئامادەبێت دڵی بداتە بەرگوللە، لەبری ئەوەی وێنەی کچی تێدایە، بارێکی تر شیعری وەها بۆهیچ کچێك ئاڵێت:

بۆ (ئازادی رەمزی ئەفەندی) وتراوە کە قوتابی کۆلیجی پزیشکی بووە لەئەستەمبوڵ و، لەغەریبی لاویدا مردووە:

درەختی رەنجی چەند ساڵەم، کەمی مابوو چرۆدەرکا
کەمی مابوو بەری باخم، ژیانم پڕ لەسێبەرکا
بەڵام ئاواتە من ئەژیام، لەکونجی دوور وڵاتێکا
لەپڕ مردن، تەلاری ژینمی رووخان، لەساتێکا

١٩٦٩/٣/٦

بۆ شێخ ئەحمەدی شێخ رەزای بەرزنجی وتراوە، کە لەنەخۆشخانەی سلێمانی کۆچی دوایی کردووە:
ئەتا مابووم، دەسی تاسەم، نەگەییە چاکی دڵخوازێ
نەمزشم مەستی بۆنێ بوو، نە گوێچکەم کەیلی ئاوازێ
کە مردیشم لە ژوورێکی نەخۆشخانەی سلێمانی
نە دڵسۆزێ لەدەورم بوو، نەکەس بەو مردنەی زانی

**بۆ (شێرزادی کاکە جەزا) وتراوە کەلە کۆلیجی کشتوکاڵ لەعەمرەتی لاویدا کۆچی کردووە:**

هەموو ئاواتی ناکامم گوڵاڵەی لالەزارێ بوو
شریتی سەرگورشتەی من خەونێکی نەوبەهارێ بوو
هەموو پێچانەوەی ژینم، بریتی بوو لە چیرۆکێ
لەکورتی و زوو بەسەرچوونا بزەی سەرلێوی یارێ بوو

١٩٨٠/٣/١٧



PDF 4 KURD

نەزانم دڵ هەیە وەک مس کە ژەنگ دێنێ بەئاسانی
دڵی تۆ زێڕی تێزابە لەکوێوە ژەنگی هەڵانی